خودا گوێبیستی دەنگتە بۆیە پێی بڵێ .








## پێشەکی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ *
(بەناوی یەزدانی مەزن ، دروستکەری ئەرزو ئاسمانەکان ، کە هەمیشە سوڵتانی دڵانە و دەسەڵاتدارە و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەروا لە دونیا و دوارۆژدا ،چاودێرو پارێزەرە بەسەر هەموو دروستکراوەکانی دا ،کە ئاگادارە لە هەموو خەمەکانت ، پێکەنین و دڵخۆشیەکانت ، بەخشندەیەو چاوپۆشی لە تاوانەکانت دەکاو لێت خۆش دەبێ.
خودای گەورە لو سورەتی «الزمر» ئایەتی ٥٣ دەفەرمێ (۞ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ )
واتا: ئەی پێغەمبەر( ﷺ) پێیان بڵێ : خودا دەفەرمێت: ئەی بەندەکانم..ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردوە وە هەڵەتان زۆرە،نا ئومێد مەبن لە رەحمەتی خودا ، چونکە بەراستی ئەگەر ئێوە تەوبەی راست و دروست بکەن ، خودا لە هەموو گوناحو هەڵەکانتان خۆش دەبێ ، چونکە بێگومان ئەو خوایە زۆر لێخوشبو لێبوردەیە زۆر بە سۆز و مهرەبانیشە .

پێغەمبەران زۆر جوان ستایشی ئەو زاتە مەزنەیان کردوە وەک ئەوەی کـە
پێغەمبەر سالح فەرمویەتی(إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ )
واتا:بـەراستی پەروەردگارم زۆر نـزیک و دوعا وەرگرە .
وە پێغەمبەر شوعەیب فـەرمویەتی(إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ )
واتا:بـەراستی پەروەردگارم مهرەبان ودڵسۆزە .
وە پێغەمبەر یوسف فـەرمویەتی (﴿ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ)
واتا :بـەراستی پەروەردگارم بە سۆزە بـەرامبەر ئەوەی بیەوێ بەراستی هەر ئەو زانای کاردروستە.





## ئـــامـانـجی نـوســـەر

دەمــەوی ئــەو کتێبە پێشکـەش بـەو کەسانـەکەم کە بۆ ساتـێکیشبێ بێهیوا بوون ، شەیتانـی دوژمـن لـە ناخیـان زاڵ بـوەو بـێ هیوای کـردوون، ئـەوانـەی تـاریکی نـاخـی تـەنیـون هیوادارم بـە خوێندنەوەی تـروسکـەیەکی هیـوا لـە نـاخت بگـەشێتـەوە لـەو تـاریکـو مـاتیەی نـاخت تیشکـێکی ئـومێد بدرەوشێتەوە چـونکـە ئێمـەی مرۆڤ هەرگیز نـابێ لـە خودای تـاکـو تـەنیا بـێ هیوا بین ،لـەکاتێکدا دەزانین کـە هـیچ شتێـک مـەحال نیە .وە پێویستـە هـەمـوو کـات باورمـان بە پـەروەردگـارمان هـەبێ .

هەروەکو « علي الطنطاوي»دەڵێ
وا گومان مەبە خودا وەڵامی نزاکانت ناداتەوە ، خودا بیسەری نزاکانتە،
کارەکانت بەڕێوە دەبات ،
هەموو چاکەیەک دەهێنێتە ڕێت
هەموو خراپەیەکت لێ دور دەخاتەوە ،
دڵنیابە خودا لە یادت ناکا .



سەرەتا بۆئەوەی بێ هیوا نەبی پێویستە لە ژیان تێبگەی.
لە ئامانجت لە دونیاو دوارۆژ تێبگەی .
پێوەستە دەربارەی مردن بزانی .
دەربارەی لەدەست دانی ئازیزان .
بۆ ئەوەی بێ هیوا نەبی دەبێ حیکمەتی لەدەستدان بزانی .
حیکەتی هەژاری .
نەهاتنە دی ئەو شتانەی دەمانەوی.
لەسەروی هەموویانەوە باورت بەخودا هەبێ لە هەموو بارو دەخێک.
باورت بە وڵامدانەوەی نزاکان هەبێ.
وە باورت بەوە هەبێ کە خودا لەتۆباشتر دەزانێ،چونکە ئەگەر باورت بە قەدەری خودا نەبێ ئەوە خوێندنەوەی ئەو کتێبە سودێکی نابێت بۆت.



سـەرەتـا بـا لـە ژيـــانـەوە دەست پـێ بكـەی
ژيـــان چـيــە ؟
خـودا بـۆ ئـێمەی دروست كـردوە ؟
ئـامـانجی بوونـەوەر لـە دوونـيا چيە؟
بـۆچی دەبـێ هـيوامـان هـەبـێ ؟

کێشەی ئاڵۆزی ژیان ئەوەیە؛ کە هاوکێشەیەکەی قورسە, ئاسان لێی حاڵی نابی, ژیان وەک ئاوێکی لێڵ وایە, تەنها بەسەیرکردنی ناتوانی درک بەناوەوەی بکەی, لە ناو ئەزموونکردنی ژیانیش ئێمە هەمیشە لەگەڵ ژیان؛ دەکەوینە موصارەعە و مولاکەمە, ڕۆژی وا هەیە مستەکۆڵەی بەهێزت؛ پێدەکەوێ بەر زەوی دەکەوی, بەڵام دەبێ هەستیەوە و نەدۆڕێی, ڕۆژێکی تر بریندارت دەکا, نابێ شەکەت بی و ئینسیحاب بکەی, دەبێ تۆ زبر بی و بەهێز بی, هەموو جارێ خۆم بە دۆستەکانم دەڵێم: چەند عەیبە بۆ سایەقێک؛ لەبەر بوونی تاسە لە جادە و بان, واز لە سایەقی بێنێ.. ڕێک ژیانیش؛ پڕە لە تاسە, نابێ لەبەر تاسەکان واز لە ڕۆیشتن بێنین, ئەمە ژیانە دەبێ ئەزموونی بکەی, ژیان کتێبێک نییە و بیخوێنیەوە و ڕۆژانە جێبەجێی بکەی, مانا و واتای ژیان لەناو ژیاندایە, ئێمە بەبینینی مردوو لە مردن تێناگەین تا نەمرین, وە لە عیشق و ئیمانیش تێناگەین تا نەیچێژین.



چونکە ئەم چەمکانە نابێژرێن بەڵکو دەچێژرێن, بەکورتیەکەی دەبێ ژیان ئەزموون بکەین! ئینجا تێی دەگەین, بێنە پێش چاوی خۆت لەناو سەیارەیەکی و جەوەکە تەمە, چاوت دوور نابینێ تەنها ئەوە دیمەنەی بەر جامەکە نەبێ, بۆیە دەبێ بڕۆی تا زیاتر ببینی, ژیانیش دەبێ بژییێ تا تێی بگەی واتا بە کوردی و بە کورتی؛ دەبێ تەی
بکەین..تەی
مەحوی مەزن؛ لەم دێڕە زۆر جوان ڕوونی کردۆتەوە
(لە کێ یاڕەب خەبەر پرسی بکەم من
کە هەرکەس بۆ خەبەر چوو، بێ خەبەر کەوت)
واتا/ خۆت دەبێ ئەزموونی ژیان بکەی، ئەوەی چوو نەهاتەوە؟ تا پێمان بڵێ



**چەند پرسیارێکی جدی؟**

**ئایا هەر بژین و گوێ بە ئەزموونی کەس و هیچ دەقێکی ئاینی نەدەین..!**

**ڕاستی چۆن جلوبەرگی کەسێک؛ لە کەسێکی تر جیاوازە ئاواش ئەزموونی مرۆڤەکان جیاوازە، چونکە ژیان مەتەڵێکی قورسە، ئەزموونکردنی ژیان پێویستە..!**

**هەڵەکردن لە ژیاندا**

**هەڵەکردن؛ ئامرازێکی چاکە بۆ تێگەیشتن لە ژیانکردن، چونکە هەڵەکردن وا لە مرۆڤ دەکا بە خۆی دابچێتەوە و بیربکتەوە لەوەی چی کردووە.. بەڵام هەڵەکردن؛ دوو جۆری هەیە:**



یەکەم جۆر هەڵەی ئەخلاقییە؛
کە بەپێی ئاین یاساغکراوە بۆ نمونە: ناکرێ بڵێی با زینایەک بکەم، بۆ ئەوەی تێبگەم لەوەی بۆ زیناکردن حەڕامە.! ئەمە هەڵەی ئەخلاقیە، خودا هەموو هەڵەیەکەی ئەخلاقی حەرام کردووە..
بەڵام هەڵەی ئیجتیهادی هەیە، ئەویش ئەوەیە تۆ لە ڕایەک یان بۆچوونێکت نایپێکی و بۆ دووەم جار دووبارەی ناکەیەوە..
بۆنمونە: تۆ بازرگانیەک دەکەی کە زەرەر دەکەی، هەڵەیەکەی ئەخلاقی نییە، بەڵکو ئیجتیهادییە!





ئـايـه ژيــان لـه دەستی مرۆڤه یان مرۆڤ لەبەر دەستی ژیانە!
ئەم قسەیە ئەگەر نەیکەیەنە مەسەلەی مریشک لە هێلکەکە،
یان هێلەکە لە مریشکە.. مرۆڤ؛ هەندێ جار لەبەردەستی ژیانە
بۆ نمونە کە لە وڵاتێکی هەژار نشینی، بەدەست تۆ نییە یان لە
باوکێکی هەژاری.. بەڵام تا دەمری خۆ لەبەر دەستی ژیان نابی
بۆیە کە فامل و ئاوەزت کامڵ بوو ژیان دێە بەردەستی تۆ،
بۆنمونە دەتوانی خۆ بە هەژاری نەمری ئەگەریش بە هەژاری
لە دایکبووی..



ژیانکردن؛ له کێوه فێربین؟!

قسەیەکی زۆر جوانی گابڕێڵ گارسیا مارکیز هەیە دەڵێ"باڵ بە منداڵەکانم دەبەخشم، بەڵام لێیان دەگەڕێم خۆیان بفڕن.." واتا دەبێ لەوە تێبگەین، چۆن ڕەنگی پرچ و چاومان جیایە لە یەکتر، ئاواش داستان و چیرۆکی هەموو مرۆڤێک جیایە، ناکرێ باوکێک بڵێ دەبێ کوڕەکەم ببێتەوە من، باوک؛ هەیە، حەز دەکا کوڕەکەی لە خۆی پیاو تر و باشتر بێ.. بەڵام دەبێ بزانرێ ئێستا پیاوبوون و باشتربوون جۆر و شێوزی هەیە، بۆنمونە دەکرێ کوڕەکە وە باوکی نەبێتە ئەندازیار، بەڵکو ببێتە یاریزانێکی باش.. ئیمام عەلی دەفەرموێ کوڕەکانتان وەک خۆتان پەروەردە مەکەن، ئەوان بۆ سەردەمێکی تر دروستبوون.



**ژیان بەردەوامە!**
**تا بجوڵێی ئەزموونت زیاتر دەبێ، وا باشە؛ زۆرترین جوڵەت هەبێ، بۆ ئەوەی زۆرترین سود وەرگری و زۆرترین وزە بەدەست بێنی، وەک ئەنیشتاین دەڵێ مادە+جوڵە=وزە ئەم چەند قسەیەی من کردم، لەسەر ژیان، ئەسڵەن تێگەیشتنی منە بۆ ژیان، بە قسەی من مەکە و بۆ خۆت بژی و ژیان بکە، بەڵام بیرت نەچێ نابێ دووجار یەک هەڵە بکەی یان هەموو شتێک تاقیبکەیەوە چونکە وەک دەوترێ ژەهر تاقی ناکرێتەوە.. باشترین و جوانترین یاسا لە ژیان ڕێزگرتنە.**



خودای گەورە لە قورئان حیکمەتی دروستکردنی مرۆڤی باس کردوە بەم ئایەتە روونی کردۆتەوە وباسی کردوە {وما خلقت الجن والإنس إلا لیعبدون :الذاریات:56} وە کۆتای بە مشتومری ئەوە هێناوە کە بۆچی مرۆڤ دروست کراوە .

عبدالله ی کوری عباس (رضی الله عنهما) لەبارەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت خودا مرۆڤی بۆ ئەوە دروست نەکردوە کە کاری پێیان بێت بەڵکو بۆ ئەوە دروستی کردون کە بی پەرستن و دان بنێن بە خودایەتی خودا.

شیخ عبدالرحمان ناصر السعدی موفەسیری سەردەم بەرحمەت بێت دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت خودا بۆیە مرۆڤی دروست کردوە کە دەبێ مرۆڤ دان بنێ بە تەوحیدی گشتی بەرامبەر خودا چی لەروی تەوحیدی (الالوهیة والربوبیة والاسماء والصفات) هەرکەسێ بەم جۆرە خودای پەرست ئەوا سەرفرازی دونیاو دوارۆژە.



لەم ئایەتە بەروونی ئەوەمان بۆ بەدەر دەکەوێت {الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عملا وهو العزيز الغفور :الملک :2}.

وە هەرکەسێ لە دونیا تاقی کرایەوە بە خۆشی و ناخۆشی ئەوا نابێ سەرپێچی خودابکات چونکە دونیا شوێنی تاقی کردنەوەیە لەقیامەت ئەوەی ئارامی گرتبێت لەسەر تاقی کردنەوەی دونیا ئەوا لە قیامەت پاداشت وەردەگرێت وە هەرکەسێک سەرپێچی فەرمانی خودای کردبێت ملهوڕی کردب]ت ئەوا پاداشتی بەسزا وەردەگرێت : {أفحسبتم أنما خلقناكم عبثا وأنكم إلينا لا ترجعون () فتعالى الله الملك الحق لا إله إلا هو رب العرش الكريم :المؤمنون :115-116}.

خودا کارێکی گرنگی داوە بەمرۆڤ لەسەر زەوی ئەویش بونی مرۆڤە بەخەلیفە و سەرداری سەرزەوی بۆ ئەوەی ئاوەدانی بکاتەوە چی لەرووی پەرستنبێ یان لەرووی بونیاد نانی چاکەو چاکە کردن {هو الذي جعلكم خلائف في الأرض ......: فاطر :39}

بونیاد نانی زەوی بە چاکسازی و ئاوەدان کردنەوەی بەسوود و راستە رێکردنی ژیان لە رێرەوی راست و دروست وە بلاوکردنەوەی شەرعی خودا یەکەم بونیاد نانی زەویە.



ژیـــان وەکـو دیاریـک پێشکـەشـی مـرۆڤ دەکـرێ .
وە زۆر کـەس رازین لــە ژیانـیـان ،بــەڵام ژیـــان هـەمـیشـە
ئـاسان نـیە .زۆربـەمـان کـاتێک کـە تـوشـی نـارەحتیـەک
دەبین لـە ژیـان لـەوانـەیە ژیـــان وەکـو بــار گـرانـیو
بـەڵایـەک ببینین، بـــەڵام وەک مـسولـمـانـێک ئێـمـە فێر
دەکرین کــە هیوا لـە دەست نـەدەین .کــاتـێک کـەسێـک هـیوا
بــە شتێکــەوە دەخـوازێ ئـەوە مـانـای ئـەوەیـە کـە
چـاوەروانـی شتێک دەکـات کـە وا دەکـات دڵ خۆش بێت،وە
پێویـسـتـە گـەشبین بێت بـە داهـاتوو، دەبێ بزانـــی
تروسکــای رونــاکـی لــە کـۆتـای هـەموو تـونێلـێکـە.





هیوا بە شێوەیەکی ئەرێنی بەشداری دەکات لە تێروانینی تاکە کەسو تواناکانی لە مامەڵە کردن لە ساتە سەخت و دژوارەکانی ژیان.

لەگەڵ ئەوشدا داهاتو هێشتا نادیارە.

لەوانەیە یەکێک بڵێت کە هیوا لەوانەیە زیانی زیاتر بە کەسەکە بگەیەنێت لە ماوەیەکی درێژدا ئەگەر ئامانجەکەی بەو شێوەیە نەبێ کە چاوەروانیەتی.

وەک مـسوڵمـانێک ،مـەگــەر ئـەو شتــانـەی چـاوەڕێ دەکـەین خــەیــاڵی بـن ،هـیچ هیـوایـەک ساخـتـە نـیە ،تــەنــها پێویستــە ئـەرێنــی بـیر بکـەیەوە بۆ ئـەوەی هیوا لـە دەست نـەدەی ،بیرکردنەوەی ئەرێنی ئەوەیە کە تۆ خۆت بۆ ئەو شتە باشە ئامادەبکەیت کە ڕووبدات، وە بیرکردنەوەی خراپ ئەوەیە کە تۆ بیر بکەیتەوە لەو شتانەی کە تۆ نەتەوێ ڕووبدات. ئەمە پرسیارێك نیە کە تۆ پیچەوانەی واقیع ببیتەوە، دان بەوەشدا بنێ کە ژیان کێشە و سنوری خۆی تیایە بەڵام بڕۆ بەرەو چارەسەرەکان، ئەگەرەکانیتر ببینە.



هەمیشە مرۆڤ تواناى هەبوو کە ڕاهێنان بە باشتر کردنى تواناکانى خۆى بکات، بۆیە خۆشبەختانە ئێمە ئەتوانین ڕاهێنان بکەین بۆ ئەوەى بیرکردنەوەکانمان باشتر بکەین، هەروەك چۆن بمانەوێ ڕاهینان بۆ ئامادەکردنى خۆمان بکەین لە هەر بوارێکیترى ژیاندا. ئێمە ڕۆژانە هەزاران بیرکردنەوەمان هەیە، خۆ ئەگەر هەندێ لەو بیرکردنەوانەمان نەرێنى و خراپ بن بێگومان کار ئەکاتە سەر چۆنیەتى تەندروستى و گەشەکردنمان. ئێمە خۆمان بیرکردنەوەکانمان هەڵدەبژێرین و وە هەمیشە خۆمان ئەتوانین بڕیار بدەین کە چۆن لە حاڵەتێك بنواڕین و لێکدانەوەمان بۆى هەبێ جا بە ئەرێنى بێ یان بە نەرێنى. ئێمە تەنها خۆمانین واقیع بۆ خۆمان دروست ئەکەین لە ڕێگەى ئەو بۆچون و شیکردنەوانەمان کە دەیکەین سەبارەت بەو ڕووداوانەى دەوروبەرمان.



ئەوەی کە مرۆڤێکی ئەرێنی پێ ئەناسرێتەوە ئەوەیە کە ئەو هەمیشە بەشوێن چارەسەرەکاندا ئەگەڕێت و هەوڵ ئەدات کە کێشەو ڕێگر وەك ئەگەرێك و کێبڕکێیەك لەگەڵ خۆیدا سەیر ئەکات. ئەگەر بتەوێ کەسێکی ئەرێنی بیت با چەقی قورسایت/ سەرنجت لەسەر چارەسەری نوێ و ئەگەرەکان بێت، نەك کێشە کۆنەکان. یاسایەکی باش بۆ کەسێکی ئەرێنی ئەوەیە کە هەمیشە کەمترین کات لە ڕۆژێکدا دادەنیت بۆ سەرقاڵبوونی بە کیشەکانەوە و زۆرترین کاتی بۆ چارەسەر دۆزینەوە تەرخان ئەکات. کە بۆچوونی خۆت بگۆڕی بێگومان کاتێکی زۆرتری ئەوێت لەوەی وابزانی کە بەشەو ڕۆژێك ئەگۆڕێیت، ئەمەش هەروەك ئەوە وایە کە تۆ بتەوێ ڕاهێنانی ماسولکە بکەیت کە دەست بەجێ هەست بەگۆڕانکاری لە ماسولکەکانتا ناکەیت. بەڵام کاتێك کە گۆڕانکاریت کرد لەسەر سەرنجەکانت، بیرکردنەوەکانت و هەستەکانت تەنها بۆ کاتێکی کەمیش بێت، تۆ لەماوەیەکی دیاری کراودا لە ئایندەدا هەست بەگۆڕانکاریەکان ئەکەیت.



وە دەبێ هەر یەک لە ئێمە ئەوە بزانێ کە هیچ کەس نازانی بەیانی چی روودادا ، خولەکێکی تر چی روو دەدات،چونکە کەسمان لە داهاتوو نەگەراوینەتەوە تاوەکو بزانین،بۆیە بریار لەسەر بەیانی مەدە چونکە ئەستەمە راست بێ ، لەوانەیە لە چاو تروکانکدا هەموو شتێ بگۆرێت ، ئەوەی بە مەحاڵت دادەنا بێتە بەر پێیەکانت ،ئەوەی دەتگوت هەرگیز باش نابی بە شێوەیەک باش بێ لات سەیر بێ ، ئەوەی دەڵێی مەحالە چارەسەری هەبی بەقەد خێرای هەورە بروسکەیە چارەسەر بێت، بۆیە بریار مەدە کە چی روو دەدات وە لەبیر مەکە کە خودایەکت هەیە هیچ شتێکی لا مەحالە نیە .



ئـەو خـودایـەی کــە دەریــای بۆ پێــغـەمبــەر (موسـا) ﷺ لـەت کـرد تـاوەکـو بـەنـاوی دا بـڕوا .



ئـەو خـودایـەی دوای چــەندەهـا ساڵ بــە کـراسێک بـینـای و کـورەکـەی بـۆ پێــغـەمبــەر (یعقوب) ﷺ گـەڕانـدەوە.



ئـەو خـودایـەی کـە کـاروانێـکـی پـێویـست بـە ئـاو کـرد بـۆ رزگـار کـردنـی  پێـغـەمبـەر (یـوسف) ﷺ .



ئــە خـودایــەی کــە دوای تــێپــەر بـونـی تــەمـەنێک مـنداڵێکی بـەخشـی بـە پێـغـەمبـەر (ابراهیم ) ﷺ.



**ئـەو خـودايـەی کـە سـامـی کـوڕی پێـغـەمبـەر( نوح ) ﷺ ی زینـدوو کـردەوە لـە پێنـاو پێـغـەمبـەر (عیسا ) ﷺ.**



**ئـەو خـودايـەی کـە پێـغـەمبـەر (ئەيـوب)ی ﷺ لـە نـەخـۆشـی رزگـار کـرد .**



ئـەو خـودایــەی کــە پێــغـەمبــەر (یـونـس)ی ﷺ لـە تـاریکـی نــاو نـەهـەنگ رزگـار کـرد.



هیـچ کـات کۆتـای بـە شتێـک مـەهێنـە کـە نـازانـی بـەیـانـی چـی روو دەدات، وە نــەرێنـی بیر مـەکـەوە، وە هیــچ کــات هیوا لــە دەست مـەدە.

وە پێوەیســتــە بـاش ئـەوە بزانـی کـە هـەموو کـات بـەو شێوەیـە نـابێ کـە ئێمـە هیوای بـۆ دەخـوازین بــەڵام هـەموو کـات بـەو شێوەیـە دەبـێ کـە بۆ ئـێمـە بـاشـە،





هـــەنـدێـک کـــات ژیـــان بـەو شـێـوەیـــە نــاروا کـــە ئـێـمـــە
چـاوەڕێـیـن ئـــەو شـتـــانـەمـــان بـۆ نـــابـێ کـــە هـیـوای بـــۆ
دەخـوازیـــن ، بـــەڵـــام ئـەوە مـــانـــەی ئـــەوە نـــاگـــەیـــەنـێ کـــە
کـۆتـــای دونـیـایـــە،وەنـــاکـرێ بـــێ ویـژدانـــانـــە بـریـار بـدەی کـــە
هـیـچ لـــەنـزاکـــانـت گـــیـرا نـــەبـوون،
چـونـکـــە تـــۆ بـەڵـێـنـت لـــە کـــەسـێـک وەرنـــەگـرتـــوە
خـــودا بـــەڵـێـنـــێ پـــێ داویـت ، پـێـت دەڵـــێ :
داوام لـــێ بـکـــە ، وڵامـت دەدەمـەوە.
کـەواتـــا نـــاتـوانـی بـڵـێ کـــە نـزاکـانـم قـــبـوڵ نـــەبـوون



وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ

**ئـەی خـەڵـكـینـە پــەروەردگـارتـان فـەرمـویـەتی:**
**ئـێوە هـانـاو هـاوار بـۆ مـن بـهێنن،مـن دوعـاو نـزاكـانـتـان گـیرا دەكـەم.**



ڕەنگـە خـودا بیەوێ تاقیت بکاتـەوە بــە بـەڵـایـەک کــە نــەتوانـی بۆ کـەسـی بـاس بکــەی کـەسیش لــە وردەکـاریـەکـانـی تـێنــەگـات ،بـۆ ئــەوەی تــەنهــا دڵــت بــە خــوداوە پــەیوەســت بـێ تــەنــها لــای ئــەو شــەکوای حــاڵـی خـۆی بکــات.



وه لـه قـوڵـای هـەموو خـەمو رەشبینیـەم ئـەوەت لـە یـاد بێ کـە خـودای گـەور لــە ئــایـەتی ٨ سـورەتــی (الاسرا) دەفـەرمــێ:
(عسى رَبُّكُمْ أن يبدل أحزانكم فرحاً قريبا)
واتــا : رەنـگـە پـەروەردگـارت بـەم زووانـە بـە شـادی جـێگـەی خـەمەکـانت بـگرێتـەوە.



خــودای گەورە،خۆری پڕشنگدار،لەدوای شەوی تاریکەوە هەڵدێنێت،بەهار لەدوای زستان دێنێت،ڕۆژە خۆشەکان لەدوای ڕۆژانی پڕ مەینەتیەوە دێنێت،نائومێد مەبە



وە ئـــەگـــەر کـــەمێـــک بـــاســـی مـــردن بـــکـــەیـــن



سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە مردن چارەنووسی هەموو مرۆڤێکە
دەوڵەمەند ، فەقیر ،دەسەڵاتدار ،بێ دەسەڵات ،گەورە ،بچووک
هەر هەمووی ئەبێ مردن بچێژێت وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت:
]كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ] (آل عمران:185)
هەموو کەسێك دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت (کەی ، لەکوێ ، بەچی خوا نەبێت کەس نازانێت) .



مردن راستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە هەموو ناخی مرۆڤەکان دانی پێدادەنێ وەراستیەک دەردەخات کە هەموو نەفسێک بەدەست خودایە جل جلالە تەنها خودا دەسەڵاتی بەسەرداهەیە.

بەڕاستی مردن پەند و ئامۆژگاری زۆری تێدایە ، بۆ نموونە گەر کەسێکی دەوڵەمەند یان دەسەڵاتدار یان سەرۆک عەشرەت دەمرێت :

کەسانێکی بێ دەسەڵات و لاواز و فەقیر و بێ کەس بیر دەکاتەوە کە دەسەڵات و پارە و سەروەت و سامان و عەشرەت ناتوانن رێگری لە مردن بکەن و چەند بەهێز و دەسەڵات دار و دەوڵەمەند و خاوەن عەشرەت بیت مردن هەر پێت دەگات ، کاتێک کە بیر لەمە دەکاتەوە ئەوکاتە ئاسودە و مورتاح دەبیت و بە بەشی خۆی ڕازی دەبیت و دنیای لا بێ نرخ دەبێت .



وه هەروەها پەند و ئامۆژگاریشی تێدایە بۆ کەسانی دەسەڵاتدار و خاوەن سەروەت و سامان و عەشرەت بەوەی کە چەند بەهێز و دەوڵەمەند بیت ڕۆژێک دێ مردن یەخەت دەگرێت و دنیا بە جێ دەهێڵی بۆیە ئەم جۆرە کەسانە کاتێک بیر لەمە دەکەنەوە ئەو کاتە زوڵم و ستەم لە ژێردەستەکانیان ناکەن و حەق و مافیان بە بەشێوەیەکیش جێ بە جێ دەکەن کە لە دوای مردن هەم خوای گەورە لە خۆیان ڕازی دەکەن ، وە هەم خەڵکیش بە مردنەکەیان خەمبار و دڵتەنگ دەبێت و دوعای خێریان بۆ دەکرێت و هەمیشە بە چاکە باس دەکرێن .



کەواتە پێوییستە لە سەر هەموو کەسێک بیر لە مردن و نارەحەتیەکانی بکاتەوە و بزانێت هەموو ڕۆژێک هەنگاوێک لە مردن و قەبر نزیک دەبێتەوە و کار بکات بۆ دوای مردنی چونکە هەر چەند بژیت هەر دەبێت بمریت .

کاتێک هاوڕێیەکت ، یان کەسێکی نزیکت دەمرێت پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرە و وە بە بیری خۆتی بهێنەوە کە چۆن فریشتەی مردن (ملك الموت) هاتووەتە خزمەتی بەهەمان شێوە دێتە خزمەتی تۆش، چونکە ژیان چەنێك بەردەوام بێت هەر بەمردن کۆتایی دێت، هەمووی ئەمرێت، چاکەکاران و خراپەکاران، لەخوا ترسان و گوناهکاران، پاڵەوانەکان و لاوازەکان ، ترسنۆکەکان و بوێرو نەترسەکان، ئەوانەی دونیایان خوشدەوی و ئەانەی دوارۆژیان خۆشەوی، هیمەت بەرزو بێ هیمەتەکان، هەمووی دەمرێت.



پرسیاریش لە خۆت بکە و بڵێ ئەتەوێت چەنێك بژیت؟حەفتا ساڵ؟ هەشتا ساڵ؟ نەوەد ساڵ؟ سەد ساڵ؟ دووسەد ساڵ؟ هەزار ساڵ؟ دوای ئەوە چی؟ دوای ئەوە مردن و نەمان و دفن کردن، دوای ئەوە...قیامەت.

کاتێک تۆ بیر لەمە دەکەیتەوە ئەوکاتە گرنگی بە کاتەکانی ژیانت دەدەی و لە شتی بێ سوود و تاوان و خراپەدا سەرفی ناکەی و توێشوو بۆ قەبر و قیامەتی خۆت کۆ دەکەیتەوە گەر وات کرد ئەوا بزانە تۆ کەسێکی زۆر ژیر و تێگەشتووی هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

**(( باشترینی موسوڵمانان ئەوانەن کە جوانترین خوڕەوشتیان هەیە ، و ووشیارترین و ژیرترین موسوڵمانان ئەوانەن کە لەهەموویان زیاتر یادی مردن دەکەنەوە وە لە هەموویان چاکتر خۆیان ئامادە کردووە بۆ دوای مردن )**



وە هەروەها زوو زوو سەردانی گۆڕستان بکە و سەیری گۆڕی کەسوکار و هاوڕێ و خزمەکانت بکە چۆن تا دوێنێ وەکو تۆ وابوون بەڵام ئێستا هەر ناڵێی خاوەنی ئەم قەبرانە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە دنیادا ژیاون ، کاتیک تۆ لە گۆڕی خۆشەویستانت تێڕادەمێنی ئەو کات دەزانی دنیا چەند بێ نرخە .

بۆیە با چیتر کاتی خۆمان بەفیڕۆ نەدەین و هەر ئێستا بڕیار بدەین و خۆمان بۆ کاتی مردن ئامادە بکەین و هەر کارێك باشە بۆ دوای مردن ئەو کارانە بکەین .



وەگومانم لەوە نیە کە هەمومان لە لەدەست دانی ئازیزانمان دەترسین، لەدەست دانی کەسێک کە خۆشت دەوێ لەوانەیە یەکێکبێ لە پڕ ئازاترین ساتەکانی تەمەنت،وە زۆربەمان لەوانەیە ئەو ئەزمونەمان کردبێ یان لە داهاتووبیکەین وپێویستە بەرگەی بگرین، مردنی هاورێەکت ، هاوسەرەکەت، دایکو باوکت ، خێزانەکەت ،وا دەکات شەپۆڵێک لە غەموو ئازار روو لە ناخت بکات،کە بەرگە گرتنی سەخت بێت.



بەڵام ناچاری قبوڵی بکەی،چونکە جگە لەوە هیچیترت لە دەست نایە ، ناچاری کە باوربەخۆت بهێنی کە ئەوە قەدەری خودایە و پێ رازی بی،نارەزای دەربرین هیچ سودێکت پێ ناگەیەنێ چونکە کە رووح لە جەستە دەرچوو گەرانەوەی مەحاڵە تەنهامەگەر خودا ویستی لەسەر بی ، وە کەسمان نیە کە لەو ئازارە بێ بەش بێ ، چونکە هەموو مرۆڤێک کۆتایەکەی روونە دەوڵەمەند، هەژار، موسوڵمان، ئاینەکانی تر،بەناوبانگ،کەسی ئاسای، گەورە ، بچوک، کەنجو پیرو منداڵ بەبێ جیاوازی رۆژێک ئەو روحەی کە لای ئامانەتە دەبی بڕواتەوە لەی خاوەنەکەی.



هەروەکو ئەو کاتەی کە (علی کوری أبی طاڵب) فاطمەی هاوسەری بە گریانەوە خستە گۆڕەوە فەرمووی(بەراستی لە دەست دانی یەک لە دوای یەکی ئازیزان بەڵگەیە لەسەر ئەوە پێکەوە مانەوەی ئازیزان بۆ هەمیشە نیە )



بەلام هەمیشە دەتوانی بەسەر ئەو رووداوە شومانە زاڵ بی کە دێنە رێگات،تەنها بەگە بگرە تا کات تێدەپەرێ چری ئەو ئازار و غەمە کەم دەبێتەوە.





## لا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنا

دڵتەنگ مەبە خودا لەگەڵ ئێمەیە.

با تـۆزێکـیش بـاسی بەختـەوەری بـکـەیـن.
بـەختـەوەری چـیـە ؟
چـۆن دەتـوانـین بـەختـەوەر بـین؟
بۆچی دەبـێ بـەختـەوەر بـین؟



**بەختەوەری، بریتیە لە هەستێک کەلەناخی مرۆڤدایە و خۆی دەبینێتەوە لەئاسودەیی دەروون و ئارامی دڵ و پشوودانی ویژدان، ئەمەش هەموو کەسێک هەوڵی بەدەستهێنانی دەدات لەژیانیدا.**



بــەشـێوەیــەکی تــر دەتــوانین بڵـێین :
بــەختــەوەری واتــا بەهێزی بەرامبەر هــەموو ئـەگـەرەکانـی ژیـان ،بـەختــەوەری واتــا کۆنترۆڵـکـردنـی تـورەبـونـەکـانت ،بـەختــەوەری واتــا قبـوڵکـردنـی جیاوازیـەکـان،بـەختـەوەری واتــا قـەنـاعـەتت بـەو بـەشـە هـەبێ کـە خـودا بۆی دانـاوی هـەرچـەنـدە کـەمو کـوریش لـە ژیـانـت هـەبێ،بـەختــەوەری واتـا خـەنـدەیـەک ببـەخشی بـە کـۆی خـەمـەکـانت لـەبـری فـرمێسـک رشـتـن و بێ هیوای,بـــەختـەوەری واتــا لـە دوای هــەموو خــەمێک شـادی هـەیـە،بــەختـەوەری واتــا لـە پــاش هــەموو کـەوتنێک هـەستـانـەوە هـەیـە وە لـەپـاش هــەموو دەرگـایـەکی داخـراو دەرگـایـەکی پـر رەحمـەتـی پـەروەردگـار هــەیــە.



زۆرینەی خەڵک باوەڕیان وایە بەختەوەری لایەنی مادییە و ماڵ و سەروەت و سامانە، هەندێکیش باوەڕیان وایە بەختەوەری واتا لایەنی دەروونی مرۆڤە کە بتوانێت خۆی دڵخۆش بکات.



بـۆ ئـەم مـەبـەستــە بـەختــەوەری لــە چەند خاڵـێک کـۆ دەکـەینـەوە.

١-یادی خوداو زیکر و قورئان خوێندن .
لەوانەیە چەندەها ڕێگا هەبێت بۆ بەختەوەری و دڵ خۆش بوون ،بەڵام پەسندترینیان گەرانەوەیە بۆ لەی پەردوەردگار،جوانتین کاتەکانە کەبەندەیەک ملکەچی پەروەرێن دەبێ .

بەختەوەری لە ئیسلامدا یارمەتیدانی هەژارو دەستکورتانە وەکو باس دەکەن کە لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا لەگەڵ خانمێکی دەوڵەمەند، پێشکەشکارەکە لێی پرسی: ئەو شتەی تاکو ئێستا زۆر دڵخۆشی کردوویت لە ژیانتدا چییە؟

خانمە دەوڵەمەندەکە وتی: بە چوار قۆناغی دڵخۆشی و خۆشبەختیدا ڕۆیشتووم لە ژیانمدا، تا لە دڵخۆشی ڕاستەقینە تێگەیشتووم.

یەکەمیان: کڕینی هەموو ئەو شتانەی حەزم لێیان بووە بەڵام دوای گەیشتن پێیان نەگەیشتم بە دڵخۆشی ڕاستەقینە.

دووەم: بەناوبانگ بوون و ناسراوی لــە هـەموو شـوێنـو جـێگـایــەک.
ئەمەشیان بۆماوەیەکی کاتی دڵخۆشی کردم، بەڵام هەر زوو نەماو لـەناوچوو وەکو ئـەوە نـەبـوو کـە بڵـێ هـەر کـەسێـک بـەنـاو بـانـگ بێ دڵـخۆشـە.

سێیەم: خاوەندارێتی پرۆژەی گەورە
وەکو کڕینی یانەی بەناوبانگی تۆپی پێ، یان ناوچەی گەشتیاری یان باڵەخانە و لەم جۆرە شتانە، بەڵام بەوجۆرە دڵخۆشیان نەکردم کە بیرم لێدەکردەوە.

چوارەم: هاوڕێیەکم داوای لێکردم بەژداربم لە کڕینی کورسی خاوەن پێداویستی تایبەت بۆ کۆمەڵێک منداڵی خاوەن پێداویستی تایبەت

هاوڕێکەم سووربوو کە دەبێت خۆشم لەگەڵی بچم و بیدەم بە منداڵەکان و لەنزیکەوە بیان بینم، منیش بە داواکەی ڕازیبووم و خۆم کورسییەکانم دا بەهەموویان، لەچاوی هەموویاندا دڵخۆشی زۆرم بەدی کرد، کاتێک چوونەسەر کورسییەکان وەکو ئەوەی سەیارەیەکی گرانبەهایان کڕیبێت، بەدەوری خۆیاندا دەیانسووڕاندەوە و لەناخی دڵیانەوە پێدەکەنین.

تاکو ئەو کاتەش تامی دڵخۆشیً ڕاستەقینەم نەکرد، خەریکبوو بڕۆم، یەکێک لە منداڵەکان لەناکاو قاچی گرتم، ویستم بەهێواشی دەستی لاببەم و بڕۆم، بەڵام دەستی توندکرد و بە چاوە بریقەدارەکانی سەیری ناو چاوی کردم.

دانەویمەوە و لێمپرسی، شتێکی ترت دەوێت بۆت بکەم پێشئەوەی بڕۆم؟ لێرەدا شتێکی پێوتم کە دڵخۆشی ڕاستەقینە و نەبڕاوەی پێبەخشیم.

وتی: دەمەوێت بەباشی سەیری دەموچاوت بکەم و لە مێشکمدا جوان خەزنی بکەم، بۆئەوەی لەودنیا بتناسمەوە و کاتێک خستیانیتە بەهەشت، لەبەرچاوی خودای گەورە جارێکیتر سوپاست بکەم.



زۆر راســت گــوتراوە کــە تــا هــەوڵ نــەدەی کــەسانــی تـر بــەختــەوەر بکەی خۆشــت بـەختـــەوەر نــابی .
نــاکرێ تــەنــها لــە هــەوڵی ئــەوە دابین بــەختـــەوەری بۆ خۆمان دابین بکەین پێویستــە هــەوڵ بۆ

**بەختەوەرکردنی چواردەوریشمان بدەین تاوەکو خوداش یارمەتی ئێمە بدا.**

**? ? ? ?**

**لەناو پۆل مامۆستا 40 میزەڵانی بەسەر 40 قوتابیەکانی ناو پۆلدا دابەشکرد؛**
**ئینجا داوای لێکردن کە پڕ هەوای بکەن و ناوی خۆشیانی لەسی بنووسن ، ئینجا مامۆستا قوتابیەکانی نارده دەرەوەو میزەڵانەکانی بە ژوورەکەدا بڵاوکردەوە، ئینجا داوای لە قوتابیەکان کرد لە ماوەی پێنج خولەکدا هەر قوتابیەو ئەو میزەڵانە بدۆزێتەوە کە ناوی خۆی لەسەر نووسراوە ... !!**

**کاتەکە کۆتایی هات و کەس نەیتوانی بیدۆزێتەوە**

**ئەمجارە مامۆستا داوای لە فێرخوازەکان کرد هەر یەکێک دەستی بەکام میزەڵان دەگات ناوی کێی لەسەر نووسراوە بیداتە دەستی خاوەنەکەی ئەمجارە کارەکە بە کەمتر لە دوو خولەک کۆتایی هات و هەر کەسەو میزەڵانەکەی خۆی هاتە ناو دەستی**
**بەمەش هەموویان دڵخۆش بوون ...**

ماموٚستا گووتی : ئەم میزەڵانانە بەختەوەریەکانمانن کە بەدوایاندا دەگەڕێین؛ کاتێک تەنها بەدوای بەختەوەری خۆماندا دەگەڕێن گەیشتن پێی ئەستەمە بەڵام کاتێک بەختەوەریمان بەخشیە کەسانی دیکە ئەوانیش بەختەوەریان پێمان بەخشیەوەو بەمەش هەمووومان دڵخۆش بوین.



خۆشی بخەنە دڵی کەسانی دیکە ... دڵخۆش دەبن



٢- نــاتوانــی دڵــی زۆرینــەی خــەڵک رازی بــەکــەی کــەی وازت لــەو بیرکـردنـەوەیــە هێنا کـە هـەمـوو کـەس دەبێت تــۆی بــە دڵ بێ ئــەو کـاتە بـەختەوەری،چــونــکـە هــەمـوو مـرۆڤـرکــان لــە خـوداش رازی نـین کــە دروسـتی کـردون.

بۆیە هەوڵێ ئەوەمەدە کە سەرنجی هەمووان بەلای خۆتەوە راکێشی ، لەوانەیە سەرنەکەوتنت لەو کارەت بەختەوەریەکەت بشێوێنێ.ژیانی خۆت بژی هەتا ئەگەر پێچەوانەی هەمووان بوی مەرج نیر تۆ هەڵە بیت ،لەوانیە هۆکارێک هەمووان بە هەڵەدا ببات جا دابو نەریتی کۆن یان هۆکارێکی تر .
ئاسودەی دەدۆزیەوە کاتێک تێدەگەی
هەموو شتێک شایەنی کاردانەوە نیە ،
هەموو شتێک شایەنی بیرکردنەوە نیە ،
هەموو قسەیەک شایەنی وەڵامدانەوە نیە ،
ئەو کاتەی تێدەگەی کە تۆ ئەوانت پێ ناگۆردرێت، بەڵام دەتوانی خۆت دووربگری لە وزە نەرینەکان بێدەنگ دەبت و تەنها بە زەردەخەنەیەک تێدەپەرێنی.



٣-لە رابردوو مەژی:
ژیان کردن لە رابردوو داهاتوت وێران دەکات ،بۆیە هەگیز بیر لە دوێنێ مەکەوە چونکە بەیانی
گرنگترە،هەرکەسەو رابردوێکی تاڵی هەیە بە

بیرکردنەوە لە ساتە ناخۆشو تاڵەکان مەحاڵە بەیانێکی جوانت هەبێ .

هەمومان باش دەزانین کە دوێنی هەرگیز ناگەرێتەوە،خولەکێک پێش ئێستاش ناگەرێتەوە سەقاڵبوونت بە شتێک کە گەرانەوەی نیە کات بە فیرۆدانە.




تاکە شت کە دەتوانی تەواوی رۆژەکەت بە فیرۆ بدا بیرکتدنەوەیە لە شتێک کە تێپەریوە، بەڕای من لەشوێن ئەوەی دانیشیو بیر لە رابردوو بکەیەوە چارەسەری داهاتوت بکەی باشترە،لەوانیە شتێک بتوانیایە دوێنێ بیکەی بەڵام نەتکرد ئێ بێ گومانبە

بەیانی دەتوانی باشتر بکەی ، لەبری ئەوەی خەمی بۆ بخۆی چارەسەری بکە .




هیچ کات خۆت بە رابردووەوە سەرقاڵ مەکە
ئایە دەتەوێ ئاوی روبارەکان بۆ دواوە بگەرێنەوە ؟
دەتەوێ خۆر بۆ خۆرهەڵات بگەرێتەوە؟
دەتەوێ منداڵ بۆ سکی دایکی بگەرێتەوە ؟
یان فرمێسک بۆ چاوەکان بگەرێتەوە ؟

تـا هـەرگیز ئـەو شتانـە روو نادە چونکـە مـەحالـە
بـۆیـە باشتر وایـە خۆتیـان پـێ خـەریک نـەکـەی رابـردو
وەک ئــەوە وایــە :
ئــارد بـهـارێ لــەکـاتێکدا پێشتر هـاراوە.

هـەوڵـی ئـەوە بدە پـەند لـە هـەڵـەکـانـی رابـردوت وەرگـی
،ئـەو شتــانـە دووبـارە مـەکـەوە کـە رۆژێـک ئـازاریـان
داوی،ئـەو هـەڵـەیـە مـەکـە کـە دووجـار هـەمـان کـات ئـەنـجام
بدەی کـە رۆژێـک فـرمێسکیـان پـێ رشتوی.
دەزانـی رابـردو وەکـو چـی وایـە؟
وەکـو ئـەو گـەڵـایە کـە لـە درەختێکـەوە دەکـەوێ
هـەر لـە نـزیک درختـەکـەوە دەمێنێتـەوە بـەڵـام نـاتوانـێ
بگـەرێتـەوە بـارو دوخـی جارانـی ، رابـردوش بـە هـەمان
شێوە لـە یـاد نـاکرێ بـەڵـام هـەمـان رووداوەکـان دووبـارە
نـاکرێنـەوە.

بـە کـورت و پـوختـی
رابـردوو تـەنـها شایـەنـی ئـەزمـوون کـردنـە
نـەک راوەستـان و ئـاور دانـەوە بۆی
تـەنـها سەیـری پێشـەوەت بکـە

گرینگی بە ئامانجەکەت بدە
وە لە هەموشی گرنگتر
پشت بە خودا ببەستە.



قەرەبوو لە خواوە بۆت دێ 'وەک ئەوەی هیچ شتێکت
لەدەست نەدابێ

" ثم يأتي العوض من الله 'كأنك لم تسخر شيئًا " ☐



هــەرگیز لــە یادی مـەکە خـودای گـەورە لـە سورەتـی( الروم)
ئــایـەتی ٦٠ دەفـەرمـێ :
فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ
واتــا :ئــارام بـگرە بــەڵـێنـی خـودا دێـتە دی.

برینەکانی دڵت تەنها بە خودا بسپێرە ...
ئەو باشترین مەرهەمی دونیای لایە ،
بە ئاسانی تیماری دەکات
باور بکە
هێدی هێدی بە ئاسپای
هەموو شتێک باش دەبێ
رێچکەکانی ژیان
لەلایەن خوداوە دیاری دەکرێن
کاری ئمە تەنها لابردنی وردە زیخەکانە
کەوایە ئەم هەموو هاوارو ناڵەیە بۆ چیە؟
هەموو کات ئەوەت لەبیر بێ
کە قەبارەی کێشەکانت
لە دەسەڵاتی خودا زۆر بچوکترە
کەواتە بەردەوام بە
هیوا لە دەست مەدە
هەرگیز و بە هیچ هۆکارێک.

ڕۆژێک دێت دڵە شکاوەکەت شیفای بۆ دێت
ڕێگا داخراوەکەشت بۆ دەکرێتەوە
کارە زەحمەت و ئاڵۆزەکەشت ڕاستەڕێ دەبێ

**ماندوو بوونەکانیشت دەحەسێنەوە**
**تەنها دەبێ تۆ متمانەت بە خودا هەبێ و بەردەوام بیت**



**بە دوعایەکی پێغەمبەر نوح،**
**کە تەنها چوار وشە بوو، هەموو زەوی ژێرئاوکەوت.**
**﴿ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ﴾**
**واتە: شکستم خواردووە (بێ دەسەڵاتم) دەی تۆ یارمەتیم بدە.**

سولیمانیش بە سێ وشە بووە خاوەنی هەموو زەوی.
﴿ وَهَبْ لِي مُلْكًا﴾
واتە: دەسەڵاتێکم پێ ببەخشە.

پێویست ناکات لە دوعاکانماندا زۆر بڵێین،
وشەکانی ڕێک بخەین و بیلاوێنینەوە،
بەڵکوو ئەوەی پێویستە تەنها ڕاستگۆی و دڵسۆزیتە،
خودا ڕەوانبێژی تۆی ناوێت،
خودا دڵتی دەوێت.



وە باش بزانە خودا خۆشی دەوێو لە یادت ناکا هەرگیز ناشوکری مەکە چونکە نەنیا ئەو دەزانی کە چی بۆتۆ باشە .
ئەگەر تۆ خاوەنی زیرەکترینو باشرین مێشک بێ
هەر خودا دەزانی چی بۆتۆ گونجاوە ،

لەوانەیە زۆر شت روو بدا کە بە دڵمان نەبێ بەڵام بێ گومان خێرێکی لە دوایە کە ئێمە نایزانین .
بۆیە تەنها سوپاسی بکە چونکە هیچ کات خراپەی تۆی ناوێ .
وە بێگومان بە ئەوەی هی تۆ بێت دێتە لات، تەنانەت ئەگەر لە نێوان دوو شاخیشدا بێت.وە ئەوەی هی تۆ نییە، بەدەستی ناهێنیت،تەنانەت ئەگەر لە نێوان لێوەکانت دا بێت.



(إِنَّ رَبِّی لَسَمِیعُ ٱلدُّعَآءِ)

بەراستی پەروەردگارم بیسەری نزاکانتە .

